# ناوەڕۆك

پێشەکی

ئەوروپا لە سەدەی هەژدەهەم

کۆمەڵگای نەریتخواز(سونەتی)

ئینسکلۆپیدیا(مەوسوعە)

دێنیس دیدەروت

ڤۆڵتێر

سیاسەت

ژوزفی دووەم

ئامانجەکانی ڕووناکبیری



کۆڕی فیلسوفان

## پێشەکی

ئەمڕۆ خەڵکی لە هەموو شتێك دەپر سن" هیچ شتێك بە مسۆگەر و دڵنیابەخش نازانن. بەشێك لەو پرسیارانە ئەوەیە کە دەپرسن: بۆچی دەبێ خێزانمان هەبێ؟ کەلیسا بە کەڵکی چی دێ؟ بۆ دەبێ گوێڕایەڵی مامۆستا بین؟ بۆ نابێ ئەوەی پێمان خۆشە ئەنجامی بدەین؟ وە زۆر پر سی دیکە.

هەندێك کەس پر سیاریان لە سەر نان خواردنیشیان هەیە. کتێب دەنوسن، لە ڕۆژنامە و زانکۆکان کاردەکەن، لە رادیۆ، تەلەفزیۆن و مەجلیسان بەحس دەکەن. ڕەخنەو قسەیان لەسەر هەموو شتەکانی چواردەوریان هەیە. هەندێك ڕێگەچارەو پێشنیار دەدەن بۆ ئەنجام دانی کارەکان. جاری وا هەیە هەندی کەس لەسەر ئەم بیرکردنەوەیان پارە وەردەگرن. بەم جۆرە کەسانە دەڵێن ئینتەلکتۆل (ڕۆشنبیر یان ڕووناکبیر). شێوەی ئەندیشەو کارەکانی ئێمە زۆر بەی جار دەر ئەنجامی کارەکانی ئەوانە.

ئەم خووی پرسیار کردنە لە کوێرا سەری هەڵدا؟ ڕووناکبیرەکان لە کوێوە پەیدا بوون؟ لەوانەیە هەنێ کەس بڵێن هەر لەئەوەڵەوە ئەمانە هەبوونە. هەڵبەت ڕاستە هەمیشە کەسانێك هەبوونە کە ڕەخنەیان لەو شتانەی ڕویا نداوە گرتووە و کەسانێکیش هەبوونە کە ڕێگاو بەرنامەی تازەیان بۆ خەڵکی هێناوە وەکو موحەمەد و عیسا (درودی خودایان لێ بێت) ،سوقرات و بودا. هەروەها دانایانی نێودێر هەن لە سەردەمی ڕێنسانسی ئەوروپا چ لە مسیحیەکان یاخود مو سڵمانەکان. گەر چی ئەمانە خۆیان پرسیار یان دەکرد، بەڵام شێوازی پر سیارکردنیان فێری خەڵکی نەکرد. لە ڕاستیدا، هەندێ جار خودی وەڵامەکانی خۆیان دەبوونە جێگای

ڕەخنەگرتن لە لایەن پەیڕەوکارەکانیان. ئەوانی دیکە، بەتایبەت گەنجان دەیانوت خووی پرسیارکردن شتێکی تازەیە. جیاوازی لە نێوان پیران و لاوان هەیە. پیرەکان هەر ئەو کارانە دەکەن کە پێیان دەڵێن وا بکەن بەڵام لاوەکان دەیانهەوێ خۆیان بڕیار بدەن. بۆیە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ هەر ئەم ساڵانەی ئەخیر بوو کە خەڵکی ئاسایی دەستیان کرد بەم جۆرە پرسیارانە. بەڵام لە ڕاستیدا ئەم کونجکۆڵیە لە ئەوروپای سەدەی هەژدەهەم سەری هەڵدا بە تایبەت لە فەڕانسە. لەوکاتەدا فەڕانسە گەورەترین، دەوڵەمەندترین و زۆرترین ڕێژەی دانیشتوانیشی لە خۆ گرتبوو لە چاو وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەوروپا. زمان و فەرهەنگی فەڕانسی باڵی بە سەر هەموو ئەوروپادا کێشابوو.

هەوەڵین ڕووناکبیران دەستەیەک بوون کە بە فیلسوف ناسرابوون. ووشەی فیلسوف واتە( خۆشویستنی دانایی) بەڵان لە سەدەی هەژدەهەم فیلسوف، زاناو ئەندازیار و مێژوونوسیش بوو، لەم ووشەیەدا هەموو ئەم واتایانەی لە خۆ دەگرت. فیلسوف کەسێک بوو کە دەست و شارەزایی لە هەموو زانستەکان هەبوو، بەتایبەت زانستە نوێیەکان. ئەو بزوتنەوەیە کە ئەم فیلسوفانە ڕابەرایەتیان دەکرد پێی دەوترێ ڕووناکبیری. فیلسوفەکان پێیان وا بوو کە ڕابردوو پڕە لە تاریکی، واتە تاریکی نەزانی و خوڕافات و دەمارگیری، واتە ئەوکات خەڵک بە گوێی قەشەو نەجیبزادەکانیان دەکرد. فەیلسوفەکان دەیانهەویست بە قەولی خۆیان بە تیشکی ژیری ئەم تاریکیە ڕووناک بکەنەوە.

مەبەستمان لە ژیری یان ئەقڵ چیە؟ کاتێک دەڵێین فلانە شت هۆکارێکی هەیە مەبەست ئەوەیە کە لە بارەی ئەو شتەوە ڕونکردنەوەیەک هەیە کە دڵنیایمان پێ دەبەخشێت.

بۆنموونە ئەگەر درەنگ بگەیتە قوتابخانە ڕەنگە بڵێی هۆکارەکەی بە هۆی درەنگکردنی پاس بوو" هەتا ئەگەر مامۆستاکەشت ئەم ووتەیەی تۆی قەبوڵ نەبێ لە گەڵ ئەوەشدا دەتوانی بڵێی ووتەکەم گونجاوە، واتە ئەو هۆکارەی باست کرد ڕێگەی تێ دەچێ. بەڵام وادابنێ بە مامۆستاکەت دەڵێی هۆکاری درەنگ کردنەکەت بە هۆی چەند کەسێک لە دانیشتوانی بۆشایی ئاسمان پێشیان پێ گرتبووی" ئەوکات مامۆستاش پێی وایە شێت بویتە یاخود بێڕێزی پێدەکەی و ئەوەش بەڵگەیەکی نەگونجاوە. بە واتایەکی دیکە ئێمە هەندێک لە بەڵگەهێنانەوکان بە گونجاو و هەندێکیششیان بە نەگونجاو دەزانین. ئەگەر چی ڕوونکردنەوە لە سەر جیاوازی ئەم دووانە دژوارە بەڵام دەزانین کامەیان گونجاوە و کامیشیان نەگونجاوە. ئەمڕۆ چاومان لەوەیە کە هەمووشتێک، لە جوڵەی هەسارەکانەوە بگرە تا نرخی شیرینیش هەمووی ڕونکردنەوەیەکی گونجاوی هەبێ. ئەگەر پێمان بوترێت ئەو کارە بکە لەوانەیە بپرسین (بۆچی؟). ئەگەر وڵامەکەی ئەوە بێ کە (چونکە من وا دەڵێم)، لەوانەیە ڕێت وابێت کە ئەم هۆکارە نەگونجاوە یان بڵێی بێ ئینسافیە. شێوەی بیرکردنەوەی ئێمە لە سەر بنەمای ئەقڵ وەستاوە.

بەڵام هەمیشە بەم جۆرە نەبووە. لە دەورانی ئەم فیلسوفانەدا مرۆڤەکان باوەڕیان بە جادو هەبوو و بیریان لە بەڵگە و شتی خەیاڵی دەکردەوە. خەڵک هەرئەوەی

دەکرد کە پێیان گوتبون وابکەن.  هەوەڵین جار ئەم فیلســـوفانە بوون وتیان کە مرۆڤەکان دەبێ خۆیان بیر بکەنەوە، بەڵگە بێننەوە و ڕێگای دروستی ژیان هەڵبژێرن. هەرلەبەرئەوەشـــە ئەم ســـەردەمی ڕووناکبیریەیان بە ســـەردەمی ژیریش ناوبردووە. ئەم فیلسـوفانە ناچـنە ژێر باری فکری خەڵکانی ترەوە واتە لایەنگری دروســـت بیرکردنەوەن. ئەمانە کەســـانێکن کە بە ڕەهای بیردەکەنەوە، واتە تێفکرانی ئازاد.

ســـەدان فیلســـوف هەبوونە. لەم کتێبەدا ئاماژە بە چـــەند دانەی مەشـــهوور دەکەین. خاوەن دەســـەڵات و فەرمانڕەواش هەبوونە کە پەیڕەویان لەم فیلســـوفانە کردووە. ئاماژە بە هەندێك لەم کەسانەش دەکەین. بەڵام پێش ئەمە دەبێ باس لە کات و شـــوێنی ژیانی ئەمانە بکەین.

## ئەوروپا لە سەدەی هەژدەهەم

ســـەدەی هەژدەی ئەوروپا هێڵی جیاکردنەوەی مێژووی جیهانە. لەم ســـەردەمەدا گۆڕانکاری گەورە ڕوویدا: ڕێژەی دانیشتوان بە خێرایی ڕوو لە هەڵکشان بوو-لە ساڵی ١٨٠٠ ڕێژەی دانیشتوانی ئەوروپا دوو هێندەی ساڵی ١٧٠٠ بوو. ڕێگە و ڕەوشـــی بژێوی خەڵك پێشـــکەوتنی بەخۆوەدیبوو-مەبەست لە شۆڕشی کشتوکاڵیە" لە ئینگلستان شۆڕی پیشەسازی لە سەر بنەماکانی هێزی هەڵم دەستی پێکرد" لە فەڕانسەش لە کۆتایی هەمان سەدە شورشێکی سیاسی گرینگ بەرپابوو. دەکرێ ئەم کتێبە ناوی بنرێ شـــۆڕشـــی هزری.

ئەم شۆڕشی هزریە، واتە شۆڕش لە ڕەوشی بیرکردنەوەی خەڵك کە بە ستراوە بە شۆڕشی زانستیەوە. زانستی نوێ تەواو جیاواز بوو لە زانســـتی چـــەرخی ناوین. خەڵکی لە چەرخی ناوین پێیان وابوو کە زۆرێك لەو حەقیقەتانەی کە شایستەی ناسین بوون پێشتر ناسیویانن. تەنها کارێك کە بیکەن ئەوەیە کە پێکەوە بەراوەردیان بکەن. لەســـەدەی حەڤدەیەم ئەم بیرکردنەوەیە لەناوچوو. ئیتر خەڵك بیریان لە کۆکردنەوەی زانیاری و حەقایقی تازەتر دەکردەوە بۆ سەرلەنوێ دەرك کردنی جیهان. لەبەرئەوە، دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە لە بارەی هەموو شتێکەوە، لە ئەستێرەکانەوە بگرە تا دەگاتە ڕووەك ومێرو و شـــتانی چـــواردەوری خۆیان. سەرەنجام دەستیان کرد بە گۆڕینی بیروباوەڕی کۆنی خۆیان لەبارەی سروشتەوە. لەو سەردەمەدا بوو کە ئەوروپیەکان دەســـتیان کرد بە گەڕان و ســـەفەرکردن بە جیهاندا. خەڵك ومیلەتی جیاوازتریان بینی کە عادەت و تەقالیدی جیاوازتریان هەبوو لە خۆیان. لەبۆیە دەســـتیان کردە پرســـیار کردن لە خۆیان کە ئایا ڕێ و ڕەسمی ئەوروپیەکان تاکە ڕێگاو باشـــترینە یان نا. بە تایبەتی کە هەندێك پێیان وابوو چـینیەکان سـیسـتەمێکی باشـتریان هەیە. بیرۆکەی گومان دەستی پێکردبوو. خەڵك دەستیان کـــرد بـــە دروســـــتـــکـــردنـــی بـــیرۆکـــەی تازە.



کاریکاتۆرێکی (جێگای نیگەرانی) جوتیارەکان کە نەجیبزادەو دەسەڵاتدارنی کەلیسا سواری پشتیان بوونە.

یەکێك لە گرینگترین بیرۆکە نوێیەکان بیرۆکەکەی ئیسحاق نیوتن بوو. دەیگوت کۆمەڵە قانونێکی دیاریکراو زاڵە بەسەر سروشتدا. یاسایی کێش کردن یەکێك بوو لەوانە. ئەم یاسایانە هەمان یاساکانی خودان. بە لێکۆڵینەوە و بیرلێکردنەوە دەکرێ لێیان تێبکەین. کاتێك ئەم یاسا سروشتیانە دەرك بکرێن ڕۆشن دەبێتەوە کە هەرچی لە جیهاندایە بەشێکە لە نەخشەو قەستێکی گەورە کە قەستی چاکەو خێرە.

نیوتن پایەیەکی بەرزی هەبوو لە لای فەیلەسوفەکان. زۆریان تەلاش کرد کە بیسەلمێنن کە بیرۆکەکەی دروستە و زۆر وتەیان لەبارەیەوە ساز کردووە کە ئێمە ئەمڕۆکە پێمان خەیاڵپڵاون. یەکێك لەوانە نوسیبووی خودا بۆیە کێچی ڕەش دروست کردووە بۆئەوەی بە ئاسانی لەسەر پێستی سپی ببیندرێن و بگیرێن.

هەموو ئەم گۆڕانکاریانە دەستیان خستە دەستی یەکترەوە لە کۆمەڵگا، کشتوکاڵ، پیشەسازی و هەتا شێوازی بیرکردنەوەش بۆ ئەوەی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی وەدی بێنن- واتە گۆڕانکاری لە پێکەوژیانی خەڵك.

## کۆمەڵگای نەریتخواز(سونەتی)

کۆمەڵگای ئەوروپا لە ساڵی ١٧٠٠ یەك کۆمەڵگای نەریتخواز بوو. کۆمەڵگای نەریتخوا یان سونەتی ئەوەیە کە تێکەڵەیەك لە خەڵکانێك پێکەوە لە ژێر زنجیرەیەك بنەمای دیاریکراوە بژین. ئەگەر ئەم دە ستورانەیان لە ڕابردووەوە وەرگرتبێت ئەوا بە کومەڵگای سونەتی ناودەبرێ. ڕەوشی دیکەش هەیە بۆ ئەوەی کۆمەڵگای سونەتی پێ بنا سین. لە کۆمەڵگایەکی لەم جۆرەدا خەڵك زۆر گوێ بە کۆچ و سەفەر نادەن. لە ناو گروپی بچوك ژیان دەگوزەرێنن، زۆریش خۆ لە کاری حکومەت هەڵناقورتێنن. زۆربەیان ناچنە قوتابخانە و خوێندەواریان نیە. لە لادێکان دەژین نەك لە شارەکان. زەوی گرینگترین سەرچاوەی داهاتی کۆمەڵگایەکی لەوجۆرەیە، ڕێژەیەکی کەم لە خەڵك خاوەنی زۆرترین زەویەکانن .



نەزانی خەڵک: جوتیارانی فەڕانسە پەلاماری ئەم باڵۆنە دەدەن کە وا دەزانن مانگە و کەوتۆتە خواریّ.




لە ئەوروپا ئەم کەمینەیە بە نەجیبزادە ناسـراون. زۆرینەی خەڵك تەنها پارچـە زەویەکی بچـوکیان هەبوو و جوتیار بوون. جوتیار بوون یاخود نەجیبزادە بوون پەیوەسـتی بە باوانیانەوە هەبوو و گۆڕینی ئەم بارودۆخەش تەقریبەن مەحالْ بوو. لە ڕاسـتیدا نەجیبزادەکان قەسـتیان بوو کە خەیاڵیان لەمبارەیەوە ڕاحەت بێت کە کەس کارێکی لەوجۆرە نەکات. لە ئیتالیا لە ڤێنیز کتێبێك هەبوو بە ناوی کتێبی ئاڵتونی. لەم کتێبەدا ناوی هەموو خانەدانەکان نو سرابوو وزیادکردنی ناوی دیکە تا ڕادیەك د شوار بوو. دەکریّ بگوتریّ شوعاری کومەڵگای سونەتی ئەمە بێت " وەك باوك وەك کوڕ".

نەجیبزادەکانی ئەوروپا ئاغایەتیان بەسـەر جوتیارەکانەوە دەکرد، جوتیارەکان ژێردە ستەی ئەوان بوون. لە پرۆس و نەمسا نەجیبزادەکان بە تەواوی دەست ڕۆشتو بوون بەسەر ژیانی جوتیارەکانەوە. لە پرۆس ئەم دە سەڵاتە بە یا سایی کرابوو.

باشترین لە شوغڵەکان هی نەجیبزادەکان بوو. لە لەشکردا ئەفسەر بوون و لە حکومەت و کەلیسا شوغلّ و پلەی چاکیان هەبوو. ئەوان لە بەشێکی زۆری ماڵیاتیش خۆیان دەبوارد و لە مەشدا فشاری زیاتری ماڵیات دەکەوتە سەر شانی جوتیار. یاخود کەمیان ماڵیاتیان دەدا و زۆرجار لەسەر ئەو تاوانانەی دەشیانکرد نەدەکرا



له هۆڵی مۆدی جلوبەرگ

دادگایی بکرین. بەمانە دەوترێ تازیاری نەجیبزادەکان. ئەمڕۆ کە دەوترێ کەسێك سەرپشکە مەبەست ئەوەیە کە شتێکی هەیە بەڵان موستەحەقی ئەو نیە. بەڵام لە ساڵی ١٧٠٠ مەبەست لە سەرپشك یان تازیاری شتێك بوو کە وەك مافێکی یاسایی خاوەنی بوو.

هەڵبەت لەمە شدا کە سانی شاز هەبوون کە خاوەنی هیچ شتێك نەبوون لەگەڵ ئەوەی نەجیبزادەش بوون. لە ساڵی ١٧٨٩ لە فەڕانسە نزیکەی ٢٥٠٠٠ نەجیبزادە هەبوون، بەڵام نزیکەی هەزار کە سیان خاوەن دارایی و سەروەت بوون. لە هەندێك لە وڵاتان ڕێگە دەدرا بۆ ئەوەی کە سێك خۆی بکات بە نەجیبزادە. دەبینین لە فەرانسەو بەتایبەت لە ئینگلستان، کە بازرگانەکان و کەسانی خاوەن پلە و پایە بوون بە نەجیبزادە. بەڵام لە فەرانسە بە نەجیبزادەی دەستە دوو لە قەڵەم دەدران.

ڕێژەیەکی کەمی خەڵك لە شارەکان دەژیان. ژیان لە شارەکان بەئەندازەی ژیانی لادێ دشوار نەبوو، بەڵام هاوکات خێزان دەوری خۆی دەبینی لە دیاریکردنی کار و پلەوپایەی خەڵك. لە شاری فڕانکفۆرتی ئەڵمانیا کە دەکەوێتە کەناراوەکانی ڕووباری ماین، بە شێوەیەکی یا سایی خەڵکیان بە سەر پێنج دەستە دابەشکردبوو. هەر گروپەی دەبوایە جلوبەرگی جیاوازی پۆ شیبایە بۆ ئەوەی زوو بناسرابایەوە کە لە کام گروپەیە. بەڵام شارەکان گۆڕانکاریان بە خۆوە دەبینی. هەندێك لە کوڕان چوونە قوتابخانە و شوغڵی چاکتریان دەستکەوت وەك پارێزەر و پزیشکی و شتی دیکە، لەم ڕووەوە مەرتەبەیەکی مامناوەندی تازەیان بونیاد نا. بەڵام کوڕەکانیش کاتێك دەیانتوانی بچنە قوتابخانە کە بەرامبەر کێشەکانی خێزان ڕاوەستاو بن. چەند دانە لە فیلسوفەکان لەم ڕێگایەوە دەستیان پێ کرد.

ENCYCLOPÉDIE, OU DICTIONNAIRE RAISONNÉ DES SCIENCES, DES ARTS ET DES MÉTIERS, PAR UNE SOCIÉTÉ DE GENS DE LETTRES.

Mis en ordre & publié par M. DIDEROT, de l'Académie Royale des Sciences & des Belles-Lettres de Prusse; & quant à la PARTIE MATHÉMATIQUE, par M. D'ALEMBERT, de l'Académie Royale des Sciences de Paris, de celle de Prusse, & de la Société Royale de Londres.

TOME PREMIER.

A PARIS,

Chez BRIASSON, DAVID l'aîné, LE BRETON, Imprimeur ordinaire du Roy, DURAND.

M. DCC. LI.

AVEC APPROBATION ET PRIVILEGE DU ROY.

ڕووی دەرەوەی (کتێبی) مەوسوعە یان ئینسکلۆپیدیا

ئێستا ئەم کۆمەڵگا سونەتیە لە گەڵ کۆمەڵگایەکی نوێ بەراوەرد بکە. لە کۆمەڵگایەکی نوێدا زۆرترینی خەڵك لە شارەکان دەژین. دەتوانن بخوێننەوە. زۆر سەفەر دەکەن. حکومەت ڕ شکێکی گەورەی لە ژیانیاندا هەیە. گەر چی هێشتا هەبوونی باوکێکی دەوڵەمەند یاخود هاوڕێیەکی دەستڕۆشتوو یارمەتێکی چاکە بەڵام لە ئێستادا وەك ڕابردوو ئەوەندە موهیم نیە. وجودی تۆ زیاتر وابەستەیە بە تواناکانتەوە کە چی دەتوانی ئەنجام بدەی، نەك بە ئەوەی باوکت چی ئەنجام داوە. ئەگەر نەتوانی ئەوکارەی پێت ئەسپێردراوە ئەنجامی بدەی ئەوا ئیزن دەدرێی" بەڵام ناکرێ نەجیبزادەیەك لە کار بێکار بکرێ. گۆڕانگاری لە کۆمەڵگای سونەتی بۆ کۆمەڵگای نوێ گۆڕانکاریەکی ڕیشەیە. گرنگی ئەم فیلسوفانە لەوەدایە کە ڕێگەی بەراوەژووکردنەوەی شتەکانیان پێ نیشان داین.

ژمارەی فیلسوفەکان کەم بوون. ئەوان زیاتر لە مەرتەبەی مامناوەندی نەجیبزادەکان و کەلیسا بوون. تەنها چەند دانەیەکیان بژێویان لە سەر نوسینەکانیان بوو. کتێب نرخی گران بوو. نرخی ئینسکلۆپیدیا یان مەوسوعە- کە دواتر لەسەری باس دەکەین- چوارده پۆند بوو، کە لەو کاتەدا پارەیەکی زەبەند بوو. زیاتر لە نیوەی خەڵکی فەرانسە خوێندەواریان نەبوو. هەروەك ئەمڕۆ، زۆربەی ئەو کەسانەی خوێندەواریان هەبوو خۆیان بە بابەتی سەربە گێچەڵەوە سەرقاڵ دەکرد تا کتێبە گرینگەکانی



توێکاری لە مەوسوعەدا

فیلســـوفەکان. بازاڕی ئەفســـانەی پەریەکان گەرم بوو. خەڵکی باوەڕیان بە جادوو شتی وا هەبوو. لە ساڵی ١٧٨٠ کە سێکیان لەبەرخاتری جادووگەری لە فەراز سە کو شت، ئەمە لە کاتێکدا دابوو کە هەوەڵین تاقیکردنەوەی فڕینی باڵۆن ئەنجام درابوو. لە ســـاڵی ١٧٨٣ باڵۆنێك لە نزیك پاریس نیشتەوە و جوتیارەکانیش لەت و پەتیان کرد وایان زانی مانگە. تەنها جوتیارەکان نەبوون کە خوڕافاتی بوون. پزیشـــکی فەرمانڕەوای پارێزگای بایرۆن وێنەی مەریەمی موقەدە سی وەك دەرمان بۆ نوو سی بیخوات تا مێکوتەکەی چاك بێتەوە، ئەویش خواردی.

فەیلە سوفەکان هە ستیان بە ناکامی دەکرد. بیریان لەوە دەکردەوە گە ئەوان لە خەڵکانی دیکە ژیرترن. بۆ هەرشـــوێنێکیان کە دەڕوانی خوڕافات و نەفامیان بەدی دەکرد. ئەگەر خەڵك بیریان کردبتیەوە تێ دەگەیشتن کە ئەم شـــتانە چـــەندە نادروســـتن. بەڵام ئەوان بیریان نەدەکردەوە. تەنها ئەوەیان دەکرد کە پێیان دەکوتن. بۆچـــی وا بوو؟ فیلســـوفەکان لۆمەی نەجیبزادەکانیان دەکرد لەم بارەیەوە. فیلـ سوفێك بە ناوی هوڵباخ نو سی( ئایا بۆ زۆرینەی خەڵك ڕاســـتە کە یەکریز کار بکەن و چـــەوســـاوەو ژێرباری دەســـتەیەکی خۆێن مژو موفتەخۆر بن). بەڵام، لەمە زیاتر لۆمەی کەلیسایان دەکرد. کەلیسا زۆر دەوڵەمەند بوو و قودرەتی زۆری هەبوو. پەروەردەو فێربوونی لە بەردەســتدا بوو. فیلســـوفەکان دەیانوت ئەوە کەلیســـایە کە درۆ لە گەڵ خەڵك دەکات ئەگەر خەڵك باوەڕ بەو درۆیانە نەکات کەلیسا سزایان دەدات. ئەوان




دروستکردنی شوشە لە مەوسوعە

دەیانپرسی بۆچی کەلیسا لە کۆڵ خەڵکی نایێتەوە تا ئەوەی کە خۆیان چیان پێ باشە باوەڕی پێ بێنن؟ لەبەرئەوە فیلسوفەکان هێرشیان دەکردە سەر دوو لە دامەزراوە گەورەکانی ئەوروپا، نەجیبزادە و کەلیسا.

## مەوسوعە

گرینگترین بەرهەمی ئەم فیلسوفانە کە لە دوای خۆیان جێیان هێشتووە، مەوسوعە(ئینسکلۆپیدیایی) گەورەی فەڕانسیە. ئەمرۆ مەو سوعەی زۆر و جیاواز هەن کە خەڵك کەڵک یان لێوەردەگرن. مەوسوعە هەموو زانستە مرۆڤایەتیەکان لە خۆ دەگرێت. ئەم کارە لەسەدەی هەژدەیەم دەستپێکرد. مەوسوعەی فەڕانسی هەوەڵین مەو سوعەی ئەوروپایی نەبوو. لە ساڵەکانی ١٧٢٨ تا ١٧٢٩ ئەفرائیم چەمبەرز لە ئینگلستان سیکلۆپیدیا یاخود فەرهەنگی جیهانی هونەرو زانستەکانی بەرهەم هێنا. ئەم مەو سوعەیە پێ شەنگ بوو بۆ مەو سوعەی چەمبەرز. بەڵام گەورە نەبوو. تەنها لە دوو بەرگ پێك هاتبوو. هەتا بەر لە چەمبەرز کەسێکی فەرانسی بە ناوی پیر بیل شتێکی هاو شێوەی ئەوی نو سیبوو. لە ساڵی ١٦٩٧ بیل فەرهەنگی مێژووی و ڕەخنەی بە چاپ گەیاند. ئەم فەرهەنگە پڕ بوو لە نامیلکە لەبارەی خەڵکەوە" ئێمە ئەمرۆکە ئەم فەرهەنگە ناودەنێین فەرهەنگی بەسەرهات یاخود ژیاننامە. بەڵام کارەکانی بیل تەنها دووپاتکردنەوەی نوسینەکانی پێش خۆی نەبوون کە خەڵکانی دیکە نوسیبێتیان. ئەو نوسینەکانی پێش خۆی هەموو دەبردە ژێر پرسیارەوە. ئەم نەقد کردنەی ئەو هەتا کتێبی پیرۆزیشی دەگرتەوە. بیل سێ بنەمای دانا. یەکەم ئەوەی کە ئەگەر بەرهەڵستکارەکەت لەبارەی شتێکەوە قسە دەکات کە هەڵەیە، ئەوە پێش ئەوەی ڕاستیەکەی پێ بڵێی یەقینت هەبێ کە خۆت ئەو شتە باش دەزانی. دووهەم هەوڵ بدە مەیەڵە هە ستەکانت بە لاڕێتدا ببەن. سێهەم، باوەڕ بە هیچ شتێك مەکە مەگەر ئەوەی بەڵگەی ڕۆشن بۆ ئەو شتە بزانی. ئەمە هەمان ئوسوڵی مەوسوعەی فەڕنسەویش بوو. کەسانێکی زۆر مەوسوعەکەیان نووسیەوە. زۆربەی ئەم فیلسوفە گەورانە بابەتیان لەم مەوسوعەیەدا نووسیوە.

لە هەوەڵەوە مەوسوعەیەکی گەورە بوو لە زانیاری کە کۆکرابوونەوە. پێکهاتەیەك بوو لە وەردەکاری ڕووداوەکانی زانستی و پیشەیی، وەکوو بەدەستهاتنی ئاوریشم، شو شە سازی و فلزکاری. مەبە ست لە مەو سوعە یەکەم کورتەی ئەو شتانە بوو کە خەڵکی لە بارەی جیهانەوە دەیانزانی بۆ ئەوەی بیخەنە بەردەستی خەڵکی دیکەش. دووەم، هەر وەکوو نوسەرەکەی دەڵێ، ئامانج




چاپ له مه‌وسوعه

له مه‌وســـوعه ئاڵوگۆڕ كردنی شـــێوازی بیركردنه‌وه‌یه‌، خه‌ڵكی به‌ره‌و بیری زانســتی به‌رن. ســێهه‌م، ئامانج ڕخنه گرتن بوو له كۆمه‌ڵگه. نوســـه‌ره‌كان جورئه‌تی ئه‌وه‌یان نه‌بوو كه ڕاســـته‌وخۆ كارێكی له‌وشـــێوه‌یه بكه‌ن“ ته‌نها ده‌یانتوانی ئاماژه‌ی پێ بكه‌ن، به‌ڵام ئه‌م ئاماژانه‌ش ڕۆشـــن بوون كه لێی تێبگه‌ن. تا ئه‌وه‌ی كه دوای چـــاپ كردنی دوو به‌رگی هه‌وه‌ڵ، ده‌وڵه‌ت مه‌وسوعه‌ی یاساغ كرد. به‌ڵام هێ شتیان به شێوه‌ی ناڕه‌سمی به‌رده‌وام بێت. پێنج به‌رگی دیكه‌ش بڵاو كرایه‌وه ودواتر چـــه‌ند ڕۆژنامه‌یه‌كیش بڵاوكرانه‌وه وه له كۆتایدا له ســاڵی ١٧٥٩ به‌ته‌واوی قه‌ده‌غه كرا. به‌ڵام نوســـه‌ران كاره‌كه‌یان به نه‌هێنی به‌رده‌وامی پێدا وه له ســـاڵه‌كانی ١٧٦٥تا ١٧٦٦ ئاخرین ده به‌رگی پێكه‌وه بڵاو كرده‌وه. دواتریش



جان لێرۆن دالامبر

چەند بەرگێک لە وێنە چاپ کران. سەرئەنجام مەوسوعە لە ساڵی ١٧٧٣ تەواو بوو. پێش ئەوە شتێکی وا نەبینرابوو. مەوسوعەکە پێك هاتبوو لە ١٧ بەرگ نوسین و ١١ بەرگ وێنە. چوار هەزار دەورەی لێ فرۆشرا. بۆ ئەوەلین بار ئەندیشەو دۆزینەوە نوێیەکان لە تەنیشت یەکەوە نوسرانەوە. هەڵبەت نوسەران هەموو شتێکیان نەدەزانی وە خۆشیان ئەمەیان قەبوڵ بوو. بۆنموونە لە نامیلکەیەك لەبارەی درەختی ئەگوئاپا نوسەر نوسیویەتی: وای بۆ ئەوانەی کە لەم درەختەوە نزیکن و زیاتر لەو نازانن. بەڵام ئەمە زۆر جالبە ئەگەر بزانین کە خۆیان چەنیدان دەزانی.



دێنیس دیرۆ

## دێنیس دیدەروت

ئەو کەسەی لە پشت نووسینەوە و سەرپەرەشتی مەوسوعەکە بوو، دنیس دیدیروت بوو. ئەو لە ساڵی ١٧١٣ لە لانگێر لە ڕۆژهەڵاتی فەڕانسە لە دایك بوو. باوکی چەقۆسازو پۆشتە بوو، دەیویست کوڕەکەی ببێت بە قەشە یان پارێزەر یاخود پزیشك. بەڵام دیدرۆت ڕەدی دەکردەوە. ڕێگەی پاریسی گرتە بەر بۆ ئەوەی ببێتە نوسەر. لەوێ ژیانی دەست پێکرد و بە شت نو سین نانێکی بۆ خۆی پەیدا دەکرد، لە قاوەخانە و ماڵە گەورەکان لە گەڵ دۆستەکانی ئاڵوگۆڕی بیروڕاکانیان دەکرد. زۆری نەبرد بە هۆی نوسینەکانیەوە لە گەڵ پۆلیس کەوتە گیروگرفتەوە و لە ساڵی ١٧٤٩ سێ مانگ دەستبەسەرکرا. ڕاپۆرتی پۆلیس دەڵی" ئەو کە سێکی زیرەکە بەڵام مەتر سیدارە". زۆر گونجاو بوو بۆ نووسەری


تەلارسازی لە مەوسوعە

چـــونکە خۆشـــی لە هەموو شـــتێك دەهات. هەوەڵین ڕۆشنبیری ڕاستەقینە بوو. شەو و ڕۆژ شتی دەخوێندەوە وە لەبارەی هەموو شـــتێکەوە شـــتی دەنووســـی لە دین و سیا سەت بگرە تا هونەرو زمان. هەتا لە مەو سوعە چەند مەقالەیەکی لەبارەی فلزکاریەوە نووســی. لە دژی هەموو دەســـەڵاتێك ڕادەپەڕی، چ دەســـەڵاتی کەلیســـا یاخود دەوڵەت. یەقینی بە هیچ شـــتێك نەبوو. بەم شـــێوە یە دەنووســـیٚ" گومان هەوەڵین هەنگاوە بەرەو ڕاســـتی". کاری نوسینەوەی مەوسوعە ٢٠ ساڵ درێژەی کێشا. کاتێك لە ساڵی ١٧٧٣ نوسینەوەی مەوسوعە کۆتایی پێهات چووە ڕوســـیا بۆ ئەوەی چـــاوی بە ئیمپراتۆری گەورە کاترین بکەویٚ. ئەو کاتە بیری لەوە دەکردەوە کە توانیویەتی کەســـێك بدۆزێتەوە ئەندێشـــەکانی بکاتە واقعیەت و بە ئەنجامیان بگەیەنێت. هەموو ئەو چاکسازیانەی دارِشت کە کاترین پێویســـت بوو پەیڕەویان بکات. کاترین دەڵیٚ" دەبیٚ هەموو شـــتێك لەبناغەوە تێك بدریٚ بۆ ئەوەی جێگا بۆ ئەم بیرۆکانە بکرێتەوە" بۆیە کاترین خۆی بە دوور گرت لە جێبەجێکردنی. دیدرۆت ئەوەندە پەســـت بوو کە ڕاچـــەڵەکی وە بە شـــێوەیەك لە ئەژنۆی دا کە کاترین بۆ چـــاوپێکەوتنەکانی دیکە ناچـــاربوو مێزێك لە نێوانیان دابنێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشـــدا چ فایدەی نەبوو، کاترین دووبارە دەنوسیٚ" ئێوەی فەیلەسوف خۆشبەختن. ئێوە لە سەر کاغەز دەنوسن و کاغەزیش هەمیشە بە سەبرە. بەلام من وەکو ئیمپراتۆر دەبیٚ لەسەر پێستی مرۆڤەکان بنووسم کە زۆر هەســـتیارە". دیدرۆ گەڕایەوە بۆ پاریس. بەڵام لە کۆتایدا خەڵك هەوڵیاندا کە ئەندیشـــەی فەیلەســـوفەکان لەسەر مرۆڤەکان تاقی بکەنەوە.


کاترینی دووەم


بنەماڵەی کالا

## ڤۆڵتێر

بەناوبانگترینی هەموو ئەم فیلسوفانە ڤۆڵتێر بوو. لە ساڵی ١٦٩٤ لە پاریس لە دایک بوو. ناوی ڕاستەقینەی فرانسوا ماری ئارونە بوو کە خۆی ناوی ڤۆڵتێری بۆ خۆی هەڵبژاردبوو. یەکێك لە زیرەکترینەکان کە تاکوئێستا جیهان بە خۆیەوە دیوە. بەدرێژای ژیانی هەر دەینووسی. کتێبەکان، شانۆنامەکان و شیعرەکانی حەفتا بەرگ دەبێت و نامەکانیشی ١٠٠ بەرگ دەبێ. هەموو ئەوروپا کتێبەکانی دەخوێننەوە" بەناوبانگترین نووسەری زەمانی خۆی بوو. نوسینەکانی ئەویش ، وەکوو نوسینەکانی دیدروت بوونە هۆی دەردەسەر بۆی و بە هۆیەوە دوو جار دەستبەسەرکرا. جارێکیان، لەبەرئەوەی یەکێك لە بەگزادەکانی ئازاردابوو و نۆکەرەکانی ئەو بەگزادەیەش ڤۆڵتێریان وەبەر داران دابوو. ئەم کارە نەبووە هۆی ئەوەی کە ئیتر زۆر خۆشی لە بەگزادەکان بێت! ناچار بوو بارگەوبنەی بپێ چێتەوە بەرەو هۆڵەند و ئینگلستان و دواتر دوور لە پاریس دەژیا. ساڵەکانی کۆتایی تەمەنی لە دەرەوەی فەڕانسە لە ناوچەیەك بە ناوی فێرنە بەسەر برد. خاکی ئەم ناوچەیە بەقەدەر هەرسێ وڵاتی فەڕانسەو سویسراو ژنو بەرفراوان بوو. دەستی لە نوسین هەڵنەگرت. نێوباگی لە جیهان دەنگی دایەوە وەتا پاشاکانیش خۆشحاڵ بوون بە نوسینی نامە بۆی.

ڤۆڵتریش بەهەمان شێوەی فەیلەسوفەکانی دیکە هۆگری هەموو شتێك بوو. بەتایبەتی خۆشی لە دین و مێژوو دەهات. بێباوەر نەبوو. بەمشێوەیە دەنوسێ"ئەگەر خودا بوونی نەبوایە ئێمە دروستمان دەکرد بۆ ئەوەی جیهان دەرك بکەین" بەڵام ڕەقی لە کەلیسا بوو چونکە کەلیسا بە خەڵکی دەگوت کە چۆن بیر بکەنەوە، لەلایەکی دیکە شەوە کەلیسا گەندەڵ بوو. ڤۆڵتێر باوەڕی بە کتێبی پیرۆزیش نەبوو. چەندین کتێبی مێژووی نووسیەوە. یەکێك لە کتێبەکانی لێکۆڵینەوەیەك بووە لەسەر ڕەوشت(ئاداب و ڕوحیەتی گەل) کە جۆرێکی نوێ بوو لە مێژوو. ئەم کتێبە لە بارەی گەورەکان و ڕووداوەکان نەبوو. ڤۆڵتێر بەم شێوەیە دەنوسێ" من خۆشم لە پاڵەوانەکان نایەت" ئەوان لە جیهان هاتوهاوارێکی زۆریان ناوەتەوە"


ڤۆڵتێر

ئەم کتێبە پێداچــونەوەی کۆمەڵگای گشــت ســەرزەمین و کاتەکان بوو، هەوڵدانێك بوو بۆ تێگەیشــتنی ئەم خاڵە کە چ یاســایەك ژیانی خەڵك وێنا دەکات. ڤۆڵتێر بە هەمان شــێوەی نیوتن بیری دەکردەوە کە کۆمەڵە یاســایەکی گشتی زاڵە بەسەر سروشتدا.

ڤۆڵتێر زیاد لە هەموو شتێك داخوازی سەبر و ڕشوودرێژی دەکرد، و دژی خوڕافات و دەمارگیری و هەڵەشــەیی بوو. هێشتا لە سەدەی هەژدەیەم خەڵکیان ئەشکەنجە دەدا بە هۆی باوەڕی ئاینیانەوە. ڤۆڵتێر لە ســاڵی ١٧٦٢ نمونەی بنەماڵەی کالا دێنێتە گۆڕێ. ژان کالا لە ژێر ئەشــکەنجە گیانی لەدەســتدا. بەهۆی تاوانێکەوە مەحکومیان کردبوو کە نەیکردبوو، لەڕاســتیدا بەهۆی پرۆتســتانت بوونیەوە لەســێدارەدرا. ڤۆڵتێر بە هۆی نوســین و ڕخنەگرتنەوە دە ستی دایە بانگە شەیەکی گەورە و نێوی کالای خ ستە ســەر زمانی خەڵك و بنەماڵەکەی ڕزگار کرد. دواتر

نموونەی دیکەشــی هێنایە گۆڕێ. ماوەیەکی زۆر دوای مردنی شۆڕشگێڕەکان تابوتەکەی ئەویان هێنابویە پاریس. لەسەریان نووسی بوو "ئەو فێری ئازاد بوونی کردین".

ژیانی ڤۆڵتێر یارمەتیدەر دەبێت کە لەو گۆڕانکاریانەی لە بزوتنەوەی ڕووناکبیری ڕوودەوات تێبگەین. لە ســەرەتادا ڤۆڵتێر هاوڕا بوو لەســەر ئەوەی کە خودا جیهانی لەســەر بنەمای چاکە دروست کردووە. خراپە یاخود شەڕ بە هۆی ژمارەیەك کەســی خراپەکارەوە بەدیهاتووە ئەگەر خەڵك بتوانن لە خرا پە خۆ یان ڕز گار بکەن بەشــێوە یەك خۆشــبەخت دەبن کە خودا ویســتی لەســەریەتی. ئەم فیلســوفانە باوەڕیان وابوو کە تەنها خۆشــبەخت بوون شــتێکی بە نرخە. ئەوان پێیان وابوو کە ئەقڵ ڕێگەی خۆشبەخت بوونیان پێ نیشان دەدا. جا ئەوکات ژیان ڕۆژ بە ڕۆژ چــاکتر دەبێ. لەبەرئەوە مەبەســت لە ئەقڵ پێشــکەوتنە. یەکێ لەم فیلسوفانە دەنوســی" لە کۆتایدا گو مان دەکرێ کە مرۆ ڤا یەتی لە ڕێ گای ئەق ڵەوە خۆشبەخت دەبێ". ڕووداوێك بووە هۆی ئەوەی کە ڤۆڵتێرو زۆرێك لە فەیلەســوفەکان دەســت لەم بیرۆکەیە هەڵگرن، ئــەویــش ڕووداوی بــومــەلــەرزەی لــیــبســــۆن بوو.

لە سەرەتای نۆڤامبری ساڵی ١٧٥٥بومەلەرزەیەکی گەورە لە لیبســۆن پایتەختی پورتوگال ڕویدا، ئەو ڕۆژە هەموو قەشــەکان لەوێ بوون و کەلیســاش پڕ بوو لە خەڵك. لەناکاو سەقفەکە بەسەریاندا کەوت. زیاتر لە دە هەزار ژن و پیاو و منداڵ بوونە قوربانی. خەڵك بە قووڵی بیریان لەم ڕووداوە دڵتەزێنە دەکردەوە کە ئەگەر خودا و ســروشــت چاکەوخێرە ئەم ڕووداوە چۆن ڕوویدا؟ هۆکارەکەی چیە؟


فرێدریکی دووەم

ڤۆڵتێر و ئەوانی تریش کەم کەم گومانیان بۆ دروستبووکە ئەقڵی چاکەخواز و چاکەکار بوونی هەیە. ڤۆڵتێر لە چیرۆکە بە ناوبانگەکەی کاندید یان دڵساف ئەم عەقیدەی کە هەموو شتێك چاك وچاکترە دەداتە بەر پەلار.

## سیاسەت

ئەم فەیلەسوفانە دیموکراتخواز نەبوون، واتە باوەڕیان بەوە نەبوو کە مەردومی ئاسایی ئەوەندە زیرەك بن کە بتوانن کاروبارەکانی دەوڵەت ڕاست وپاستە بکەن. ئامانجیان ئەوەبوو کە کەلیسا و نجیبزادەکان ستەم لە خەڵکی نەکەن. هەڵبەت دەکرا ئەو ئسوڵەی ئەوان بە شێوەیەکی پێچەوانە بەکار هاتبایە هەر وەکوو لە شۆڕشی ئەمریکا ڕویدا. بەڵام بیرکردنەوەکانی ئەوان لە گەڵ بیرکردنەوەی فەرمانڕەوا و خاوەن دەسەڵاتەکان یەکی دەگرتەوە. فرامانڕەوایان ئەو پلەومەقامەی نەجیبزادە و کەلیسایان بە مەترسی بۆ خۆیان دەزانی، چونکە پلەو پایەی ئەوان ڕێگیر بوو لە پڕ بوونی کیسەی پاشایان. لە بەرئەوە خەرجی دەوڵەت ڕووی لە زیاد بوون دەکرد. خەرجی سوپا زۆر زیاتر ببوو و حکومەتەکانیش ئەرکی نوێیان دەگرتە ئەستۆ، بۆنموونە، لە بواری پەروەردە و فێرکردن.

لە بەر ئەوە ئێمە ڕوو بەڕوی کەسانێك دەبینەوە کە ستەمکارانێکی چاکەخوازن. یانی فەرمانڕوایانێکن ئەندیشەی ڕوناکبیرانەیان وەرگرتووە و هەوڵ دەدەن بە بونیادنانی سیستەمێك لە سەر بنەمای سیاسەتی خۆیان بەسەر عەقڵی ئەوانی تر. نموونەی ئەو جۆرە کەسانە وەکوو شاژنی ڕوسیا و فرێدریکی گەورە پاشای پرۆس، کە زۆر بە هەستیارانە ڕەفتاریان دەکرد. یاخود کەسێکی وەکوو ژۆزفی دووم، کە بەڕاستی خولیای دەستەبەرکردنی ئەم ئەندێشەیە بوو.

## ژۆزفی دووەم

ژوزف لە ساڵی ١٧٤١ لە دایك بوو. ژوزف کوڕی ماری تیرزی نەمسایی و ئیمپراتۆری فرانسیسی هەوەڵ لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمی موقدەس بووە. ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بریتی بوون لە نەمسا، هەنگاریا، بەشێك لە خاکی یوکسلاڤیا، چکسلاوکی و بەلجیکا. ژوزف پەروەردەیەکی چاك کرابوو کە شیاو و لایەقی ئیمپراتۆر بوون بێت. ژوزف کەسێکی زۆر جیدی بوو" ئەهلی چێژ

وەرگرتن و عەیش ونوش نەبوو، بێجگە لە ئەرکەکەی بیری لە شتی دیکە نەدەکردەوە. کەسێکی شاد نەبوو بەڵام پێی وابوو ئەرکی ئەو شاد کردنی خەڵکەکەیەتی. دەیوت ( لەوە ڕەنج دەبەم کە نەتوانم هەموان خۆ شبەخت بکەم). ژوزف لە دوای مردنی باوکیەوە ١٧٦٥ بوو بە ئیمپراتۆر. بەڵام تاوەکو ساڵی ١٧٨٠ دەبوایە لە گەڵ دایکی پێکەوە فەرمانڕەوایان کردبایە. ماری تیرز زۆر جیاوازتر بوو. سەختگیرو کەسێکی ئیشکە مەزهەب بوو. هێزی پولیسی تایبەتی هەبوو کە چاوەدێری ڕەفتار و ڕەوشتی خەڵکیان دەکرد. یاسای دەرکردبوو کە دامەنی ژنەکان دەبێ شۆڕتر(درێژتر) بێت. ژوزف هەمیشە لە گەڵ دایکی مقۆمقۆی بوو.

ژوزفی دووەم نیازی بە دەوڵەتێکی کارامە بوو کە بتوانێ هەندێ یاسا دەربکات و بیخاتە بواری جێبەجێکردنەوە. لە ساڵی ١٧٨٠ تا ١٧٩٠ نزیکەی شەش هەزار یاسای دەرکرد. هەندێ یاسای وەکو ئەشکەنجە، سزای کوشتن و وەحشیگەری هەموو ڕەد کردەوە. هەموان بە پێی یاسا یەکسان بوون، کە ئەم یاسایە نەجیبزادەکانیشی دەگرتەوە. جارێك نەجیبزادەیەکی ناچار کرد بە پاك کردنەوە و گەسك لێدانی ڕێگاوبانی وین. چاوەدێری کاروباری دەوڵەتی بە دەقیقی دەکرد و پولیسی نەهێنی هەبوو بۆ ئەو کارە. ژوزف بەتایبەتی هێرشی دەکردە سەر نەجیبزادەکان و کەلیسا. دەستوری دابوو هەموو ئاینەکان لەسەرخۆ و پشوودرێژبن" کۆتایی بە زۆرێك لە چاکەو خراپەی شتەکان هێنابوو. لەساڵی ١٧٨١ زۆرێك لە دەیرەکانی داخست. دەنوسێت( ئسوڵی دەیرنشینی ڕاستەوخۆ ناکۆکە لە گەڵ ژیری.) تەنها ئەو دەیرانەی بە کراوەی هێشتەوە کە کاری بەسوود دەکەن وەکو وانە وتنەوە، یا چاوەدێری کردنی نەخۆشەکان. دەیرەکان موڵك و ماڵێکی زۆریان هەبوو، دەستی بەسەر هەمووی داگرت. ژوزف هەوڵی ئەوەی دەدا کە ئۆسقوفیش بخاتە ژێر چاوەدێری خۆیەوە چونکە کەلیسا خاوەنی سێ لە هەشتی نەمسا بوو. ئەمەش دەردە سەری بۆ پاپ دروست دەکرد.

ژوزف هەمیشە خولیای هاوکاری کردنی جوتیارانی هەبوو و بە دیتنی ئەو ستەم وچەوسانەوەی جوتیاران لە لایەن نەجیبزادەکانەوە نیگەران بوو. جوتیارەکان بە پلە نزم ئەژمار دەکران و ناچار بوون لە گوندەکان بمێننەوە و خزمەتی ئاغاکان بکەن. ژۆزف لە ساڵی ١٧٨١ دەرەبەگایەتی خڕکردەوە. لە ساڵی ١٧٨٩ یاسایەکی دەرکرد کە سودی خاوەندارێتی کە جوتیار دەبوایە بیدایە بە ئاغاکانیان کەمی کردەوە. بەهەمان شێوە بێگاری جوتیارەکانیشی ڕەد کردەوە. نەجیبزادەکان لەم کارە تەواو پەست بوون، بۆیە بە ژوزفیان دەوت "خوای جوتیارەکان". هەروەها توانا یاسایەکانیشی لێ سەندنەوە وە ئەو یاسایەشی ڕەفز کردەوە کە تەنها جەنگاوەر و نەجیبزادەکان دەیانتوانی ببنە خاوەن زەوی. هەموو ئەم کارانە دەردەسەریان دروست کرد. ژوزف لە دەرەوەی وڵاتیش دووچاری سەختی بویەوە. لە ئەنجامدا لە زۆریك لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش بەرپا بوو، بۆیە ناچار بوو زۆرێك لە یاسا چاکەخوازەکانی ڕ شت گوێ بخات.. وتی لە سەرگۆڕەکەی بەم شێوەیە بنوسن: لێرەدا ژوزفی دووەم خەوتووە کە هەر کارێك کردی شانس یاوەری نەبوو.

شکستی ژوزف دەلالەت لە بێ توانایەکی ڕوشنبیری دەکا. ئەو وا بیری دەکردەوە کە هەرشتێك لە مێشکی ئەودا عەقڵانی بێت دەبێت بۆ خەڵکی دیکەش هەروا بێت. ئەو دەرکی خەڵکی ئاسایی نەدەکرد. ئەو کاتەی فەرمانی دەرکرد خەڵك دەبێت مردووەکانیان بخەنە ناو کیسەوە چونکە کارێکی نەفامانەیە کاتێك ئەو تەختە و دارە چاکانە بۆ دروست کردنی تابوت بەکاربێنن. ئەو هەستی خەڵکی لە بەرامبەر مردووەکان دەرك نەدەکرد" ئەم هەست و ئیحساساتانەشی بە شتێکی نامەعقول دەزانی. هەرایەك بەرپا بوو کە مەجبور بوو لەم یاسایە پاشگەز بێتەوە. دەیگوت خەڵکی نەزانتر لەوەن کە تێبگەن مردووەکان تەنها لاشەن و دەرزێن و هیچی دیکە.




ئاسیاوی هەوای لە مەوسوعە

## ئامانجەکانی ڕووناکبیری

بۆ چی دەبێ خولیای ڕوناکبیری بین؟ گرنگی ڕوناکبیری لە مێژووی جیهان چیە؟ سێ شت هەیە پێویستە دیقەتیان لێ بدەین. هەوەڵ ئەوەی کە هێز و توانای ڕۆژئاوا لەم دوو سەدەیەی ئەخیردا تەنها بە هۆی سەروەت و زانستەکەیەوە نیە بەڵکو پەیوەستیشە بە ئەندێشەو بیری ڕۆژئاوایی و بناغە عەقڵیەکەی. ئەوان وا بیریان دەکردەوە کە ژیرترن و ئەم ڕاستیەش لەوانەیە ئەم خاڵەش ڕوون بکاتەوە کە ئەوان باوەڕیان وابوو لە خەڵکی دیکە باشترن.

دووەم ئەوەی کە شێوەی نوێی بیرکردنەوە کاریگەری گەورەی لە کومەڵگەکانی دیکەش هەبوو. کومەڵگەی وڵاتانی موسڵمان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە سەر وتەکانی پەروەردگار بەنا کرابوو. کومەڵگای سونەتی هیندوەکانی هیندستان لەسەر بنەمای نزامی کاست(قەبیلە) پشت ئەستوورە، سیستەمی کاست بڕیاردەری کار و پلەی کۆمەڵایەتی خەڵکە. کۆمەڵگەکانی کۆنی چین و ژاپۆن لەسەر بنەمای نەریت، یان ئامۆژگاریەکانی کۆنفۆسیوس بەڕێوەدەچوو.. لەم وڵاتانە بینراوە کە چۆن ئەندیشەکانی ڕۆژئاوا هەڕەشەیە بۆ سەر کۆمەڵگەکانیان و کاردانەوەی توندیان بەرامبەر ئەو ئەندێشانە هەیە. بەڵام هەندێکی دیکە دەڵێن کە ئەگەر خەڵکی ئاسیا بیانهەوێ کێبڕکێ لە گەڵ ڕۆژئاوا بکەن و سەرکەتوو بن" نەك هەر دەبێ لاسایی داهێنانەکانی ڕۆژئاوا بکەنەوە بەڵکو دەبێ شێوەی بیرکردنەوەی ئەوانیش لاسایی بکەنەوە!

ئەم بەڵگەهێنانەوەیە بۆ ئەوەبوو تاوەکو هاوکار بێت بۆ ئەو گۆڕانکاریانە کە لە کۆمەڵگادا بەرپا ببوو.

ژوزفی دووەم

سێهەم ئەوەی کە، ئەم فیلسوفانە یەکێك لە گەنگەشە گەورەکانی مێژوویان بەرپا کرد. واتە ئەم پرسیارەیان خستە ڕوو کە ئایا تەنها عەقڵ کافیە؟ لە کوتایی سەدەی هەژدەهەم، شۆڕشگێڕانی فەڕانسە سەرەتا لە فەڕانسە و دواتر لە ئەوروپا دەستیان کرد بە بونیادنەوەی کۆمەڵگا لەسەر بناغەی عەقڵ، وا دیار دەکەوت کە هەموو شتێك بەراوەژوو بووتەوە. زۆرێك کەوتنە ئەو گومانەوە کە نەکا ئەو دەمارگیری و نەریتەکانی پێش خۆیان ئەوەندەی دەیانکوت خراپ نەبووە. ئەم بەڵگاندنە لەو کاتەوە تا ئێستا لە ئەوروپا و سەرانسەری جیهان بەردەوامی هەیە. لە لایەك کەسانێك هەبوون باوەڕیان بە پێشکەوتن هەبوو لەسەر بناغەی عەقڵ. ئەمانە دەیانوت ڕێگای عەقڵ دەتوانێ ڕۆژ بە ڕۆژ کۆمەڵگا بەرەو باشتر بەرێت و خەڵکیش خۆشبەخت بکات لە لایەکی دیکەوە کەسانێك هەبوون کە دەیانگوت عەقڵ ئەوەندەش کە دەڵێن کاریگەری لە ژیاندا نیە. خەڵکی ئەوەندەش لەسەر بنەمای عەقڵ ڕەفتار ناکەن و لە زیاتر بەختەوەربوون زۆر دووکەوتونەتەوە وە لەم گۆڕانکاریانە کە دێتە پێشێ تەنها نیگەران و ناڕازین. لە نێوان ئەم دوو دەستەیەدا کەسانێکی دیکە هەن دەڵێن وەرن با هەوڵ بدەین کارەکان باشتر بکەین، بەڵام لێگەڕێن لەسەرخۆ بڕۆین و ئەوەندەش دڵمان بە عەقڵ خۆش نەکەین.